# بیروباوەڕی
# ابی منصور الأصبهانی

معمری کوڕی أحمدی کوڕی زیاد

وەرگێڕانی
أم سارة الكردية

# بیروباوەڕی

# ابی منصور الأصبهانی

**وەرگێڕانی:** أم سارة الكردية

**ســــاڵی:** ١٤٤٣ك- ٢٠٢١ز

١٤* ٢١ سم ، ٢٦ لاپـــەڕە

**بابــــەت :** ئـــاییـــــی

## پێناسەیەکی خاوەن عەقیدەکە

ناوی: معمرِی کوڕی احمد کوڕی محمد کوڕی زیاد الأصبهانییە، بە أبو منصور بانگکراوە.

لە ساڵی ٤١٨ ھ کۆچی دوایی کردوە.

## ئەو کەسانەی باسیان کردووە

ابن تیمیە لە کتێبی{درء التعارض} (٢٥٦/٦) دەڵێت: شێخێکی ناسراوە بە (معمرِ بن احمدی اصبهانی) یەکێک بووە لە شێخە سۆفییەکان.

ذهبی لە کتێبی{العلو}(١٣٠٨/٢) ئەڵێ: پێشەوایەکی ناسراو بووە و شێخێکی سۆفی گەری و ئەهلی تەسەوف بووە.

ابن عماد لە کتێبی {شذرات الذهب} (٩٢/٥) ئەڵێ: کەسێک بووە تەواو خۆی یەکلایی کردۆتەوە بۆ خوا، واتە: زوهدێکی زۆری تێدابووە لە خواپەرستی و سۆفی گەرێتییەکەی، وە لە طبراِن و ابی شێخیش ڕیوایەتی وەرگرتوە.

من ئەڵێم: لەسەرەتای ئەم نازناوەیان سۆفی دەرچوو ئەو کەسانەی کەوا زوهدیان هەبوو و خۆیان یەکلایی کردبۆوە بۆ پەرستش و دونیا لەلایان کەمبوو،دواتر ئەم ناوە لێکێندرا بە گروپی بیدعە و خورافییەکان.

ئەوەی کە قسەی لەسەر کراوە و باسکراوە لەسەر عەقیدەی دوورترینی کەس بووە لەسەری الله اعلم.

## کۆکراوەی بیروباوەڕەکەی

پێکهاتوە لە وەسیەت کردن و دەستگرتن بە قورئان و سوننەتەوە و، ئەوەی سەلەف و چاکەکاران لەسەری و لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کۆکراونەتەوە لەسەری لە بەشێک لە بەشەکانی سوننەت و بیروباوەڕ.

## سەرچاوەی بیروباوەڕەکەی

دەرهێنراوە لە کتێبی (الحجة في بيان المحجة) لە ابی قاسم الأصبهانی لە ساڵی٥٣٥ھ.

هەروەها زیاتر من گرنگیم بەو نوسخە نوسینە دەستییە داوە، وە چوار جار پێداچونەوەی ئەم نوسخەیە کراوە، وەکو لە وێنەکەی خوارەوە دانراوە.



## لەوەسیەتەکانی دەست گرتن
## بە سونەت و بیروباوەڕی سەلەف

هێز بەخشانی ئەهلی سوننە ئەڵێن: ابو قاسم إسماعیل کوڕی محمد کوڕی الفضل التیمی الاصبهانی، لە کتێبی (الحجة في بيان المحجة) هەواڵی پێداین احمد بن عبدالغفار بن ئەشتە، لەویشەوە هەواڵی پێداین ابو منصور معمرٍ بن احمد وتی:

کاتێک بینیم سوننەت چەندە غەریب بووە و ئەو ڕووداوانەچەن زۆر بوونە و ئەوکەسانەی کەوا خاوەنی هەواو ئارەزون چەن زۆربوون پێم خۆش بوو وەکو وەسیەتێک بۆ هاوەڵانی خۆم و هەموو موسڵمانان ئامۆژگاریان بکەم کە وەسیەتەکەش لە قورئان وسوننەتدابێت، وایلێبکەین کەواحییکمەت و زانایی و داناییەک لێی فێربین و، هەروەها ئەم قسانەی خۆم کۆمکردۆتەوە لەسەر حەدیس و ئەو بۆ ماوانەی پێمان گەشتووە و ئەو کەسانەش بناسن کەوا سۆفی بوونە و لە سەلەفیانی پێشین و، هەروەها ئەوەی لەدوای خۆشیان دێن. خوای گەورە تەوەفیقی ڕێگەی ڕاستمان بدات.

١- سوننەت ئەوەیە کەوا ڕازیبیت بە قەزا و قەدەری خوای گەورە و تەسلیم بیت بۆ فرمانی خودا و ئارامگربیت لە فرمانی خودا و ئەوشتانەش وەربگریت کە خوا فرمانی پێکردوی، واتە: فرمان بکەین بە چاکە و ڕێگری بکەین لە خراپە.

٢- باوەڕ بوون وتە و کردارە و نییەت و موافەقەی سوننەتیشە واتە: لەسەر شەریعەتی الله و رسول الله ﷺ و هەروەها زیاد دەکات بە پەرستشی زیاد و کەم دەکات بە کەمکردنەوەی سەرپێچی کردن و کەم کردنەوەی پەرستش.

**٣-** قەدەر خێر و شەڕی تێدایە و ئەوەی دێت و ئەوەشی هاتوە و تێپەڕیووە، ئەوەی کەمە ئەوەی زۆرە و ئەوەی کەوا تۆ پێت خۆشە و ئەوەی پێت ناخۆشە، هەمووی لەلای الله ﷻ وە هاتوە، هەرکەسێک شتێکم بەسەربێنێت ئەوە نییە هەڵەم بەرامبەر بکات و ئەوەی هەڵەم بەرامبەر بکات ئەوەنییە کوا توشی ئەو بەڵایەم دەکات الله ﷻ خۆی پێنوسی لەسەر نواندوە و نوسیویەتی و، هەموو ئەم گەردونە چۆن بەڕێوەدەچێ هەتا ڕۆژی دوایی.

**٤-** قورئان کەلامی الله یەو بە وەحی ناردوێتی و لەویشەوە دابەزیوە و قسەی پێکردوە و دروستکرا و نییە و لەویشەوە دەست پێدەکات و بۆلای ئەویش دەگەڕێتەوە.

**٥-** هەرکەسێک بڵێ قورئان دروستکراوە، ئاوا کافرێکی تەواوە و جهمییە.

**٦-** هەرکەسێ بوەستێ دەربارەی ئەو قسانەی لەسەر قورئان بڵێ: ناڵێم قورئان دروستکراوە وە ناڵێم دروستکراو نییە، بەڕاستی ئەوە هاوڕایە لەگەڵ جەهمییەکان.

**٧-** هەرکەسێک بڵێ: دەربڕینم بە قورئان دروستکراوە، ئەوا بە ڕاستی جهمییە.

**٨-** دەربڕینم بە قورئان و وتنم بە قورئان و خوێندنەوە و تلاوەم لە قورئان هەمووی قورئانە، وە قورئانیش تیلاوە بکرێ و بخوێنرێ و گوێی لێبگرێ و بنوسرێ و، بە هەر شێوازێك مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت هەر قورئانە و کەلامی الله یە و دروستکراو نییە.

٩- باشترین خەڵك لە دوای رسول الله ﷺ کە ماون یەکەم ابوبکری صدیقە، دواتریش عمر فاروق و لەدوای ئەویش عوسمان بن عفان (خاون دوو ڕوناکییەکە) و دوای ئەویش علی بن ابی طالیب (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهم اجمعین) ئەوانە هەموویان خەلیفەی ڕاشیدینن و هیدایەت دراون و هەریەکێکیش لەوانە کە هەڵبژێردراون کەوا هیچ کەسێک شایەن نەبووە جگە لە وان کە شایستەی خەلافەت بن.

١٠- رسول الله ﷺ شایەتی داوە بەوەی ئەوانە عشرەی موبەشەڕەن کە ئەوانەش: (ابو بکر، عمر، عوسمان، عەلی، طلحة، زوبێر، سعد، سعید، عبدالرحمن کوڕی عوف، ابو عوبێد کوڕی جەڕاح (رَضِيَ اللهُ عَنْهم اجمعین).

١١- هەروەها عائیشەی ڕاستگۆ و کچی ڕاستگۆیە و خۆشەویستە و خۆشەویستی خودایە و بەڕائەتی لێکراوە لە هەموو پیسییەک، پاکە لە هەموو ڕوویێکەوە ﵂، لە هەموو خێزانەکانی رسول الله ﷺ ئەوان دایکی ئیماندارانن و داوێنپاکترین ئافرەتانی دونیان.

١٢- معاویەی کوڕی ابوسوفیان نوسەری وەحی الله بووە و کەسێکی دەستپاک و جێی متمانە بووە.

١٣- الله ﷻ بەرزبۆتەوە بۆسەرعەرشەکەی بەبێ چۆنایی و شوبهاندن و بەبێ لێکچواندن و بێ ئەوەی ڕونکردنەوەی چۆن چۆنی بۆ بدەی وەستان لەسەری دروستە و چۆنیەتی وەستانەکەش لەسەری دیارنییە و باوەڕ بوونیش پێی واجبە و نەویستنی ئەم بەرزبونەوەیە کوفرە، ئەبێ بزانین کەوا الله ﷻ بەرزبۆتەوە بۆسەرعەرشەکەی بێ ئەوەی چۆنیەتییەکەی باس بکرێت.

**١٤-** الله ﷻ هەموو دروستکراوەکانی لێدیارە، دروستکراوەکانیش هەمووی ئاشکرا و ڕوونن بۆ ئەو، هیچ تێکەڵییەک نییە و هیچ پێکەوە لکانێکیش نییە، چونکە تاکە و ڕونییەکەی تاکە لە دروست کراوەکانیدا هەیە، لەبەر ئەوەی خۆی دەوڵەمەندە و تاك و تەنیایە لەسەر تەواوی ئەو دروستکراوانەی کەوا زانستی بەسەریەوە هەیە لە هەموو شوێن و کات و زەمەنێکدا، بێ ئاگانییە لە هیچ دروستکراوێکی واتە: زانایە بە هەموو دروستکراوەکانی و تۆسقاڵە زەڕەکیشی لێ ی ون نابێت لە ئاسمان و لە زەوی، زانایە بەوەی لەناو بەحرەکاندا هەیە، ئەوەی لە سینگەکاندا شاراوەتەوە وەکو لە قورئاندا هاتوە:

﴿ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩ ﴾ الأنعام: ٥٩

واتە: وە گەڵای هیچ دارێك هەڵناوەرێ و بەرنابێتەوە ئیلا الله زانیاری پێیە گەڵای ئەو دارە کەی پێ دەگات، وە کەی زەرد دەبێ، وە کەی هەڵدەوەرێ، (ئینو عەبباس) دەفەرموویێت: «هیچ دارێك نییە لە وشکانی یان دەریا ئیلا فریشتەیەکی پێ سپێردراوە کە دەینوسێت کەی گەڵای ئەو دارە چەکەرە دەکات و سەوز دەبێت و زەرد هەڵدەگەڕێت و وشك دەبێت و هەڵدەوەرێت.» وە هیچ تۆ و دانەوێڵەیەك نییە لە تاریکی و ناخی زەویدا یاخود هیچ شتێکی تەڕ یان وشك لەسەر زەویدا نییە ئیلا الله لە (لوح المحفوظ)دا باسی هەر هەمووی کردووە و زانیاری پێی هەیە. تەفسیری ڕێبەر

الله ﷻ بیسەر و بینایە و زانا و لێزانە و قسە دەکات و ڕازی دەبێت و توڕەدەبێت و پێدەکەنێ و سەرسام دەبێ و لەڕۆژی دواییدا بە

بەندەکانی پێدەکەنێ، لە هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا چۆن بیەوێ دەفەرمووێت:

کەسێك هەیە بپاڕێتەوە تاکو لێی وەربگرم؟ کەسێك هەیە داوای لێخۆشبوون بکات بۆ ئەوەی لێی خۆشبم؟ کەسێك هەیە پەشیمانی دەرببڕێت لەسەر تاوانەکانی تاکو لێی وەربگرم؟ تاکوو بەرەبەیان.

**١٥-** ئێمە بە چاوەکانی خۆمان الله ﷻ لە ڕۆژی قیامەت دەبینین و، هیچ گومانێک نییە لە بینینی و هیچ بۆ چونێکی جیاواز نییە لەسەر بینینەکەی و، هیچ قسەیەکی زیادە نییە لەسەر بینینی هەروەکو رسول الله ﷺ دەفەرمووێت:

(ئێوە الله کەتان دەبینن لە ڕۆژی قیامەتدا هەروەکو چۆن مانگی پڕ دەبینن و، هەروەها هیچ شک و گومانێکیش نامێنێ لە بینینەکەی)

هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ القيامة: ٢٢ - ٢٣

واتە: (بە بینینی الله ڕووەکان دەگەشێنەوە) لە ڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵێك ڕوو گەشاوە و پرشنگدار و جوانن و ئەدرەوشێنەوە. لەبەر ئەوەی تەماشای الله ئەکەن. تەفسیری ڕێبەر

**١٦-** ئازاری قەبر و قیامەت ڕاستە.

**١٧-** ئەو تەنگ و چەڵەمەی ناو قەبر ڕاستییە.

**١٨-** نەکیر و مونکەڕ ئەو دوو فریشتەن لەناو گۆڕدا دێن پرسیارمان لێدەکەن دەربارەی: الله و دینەکەمان و رسول الله ﷺ وەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٧

واتە: الله باوەڕداران جێگیر دەکات بە وشەی جێگیر کە وشەی (لا إله إلا الله) یە لە ژیانی دونیا و قیامەتدا، وە لەناو گۆڕیشدا دەتوانن وەڵامی فریشتەکان بدەنەوە بە زمانی پاراو کە الله پەروەردگارمانە و محمد ﷺ پێغەمبەرمانە و ئیسلام دینمانە، کە رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: ئەم ئایەتە لەسەر سزای ناو گۆڕ دابەزیوە. وە ئەوانەی کە زاڵم و ستەمکار بن یان مونافیق بن الله گومڕا و وێڵیان دەکات و لەناو قەبریشدا ناتوانن وەڵامی فریشتەکان بدەنەوە، وە الله ﷻ ویستی لە هەر شتێك بێ جێبەجێی دەکات. تەفسیری ڕێبەر

١٩- ئەو حەوزەی رسول الله ﷺ ڕاستییە، لە نێوان عدن و عومانە، بریقەکانی هێندەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، ئاوەکەی زۆر خۆشترە لە هەنگوین، سپیترە لە شیر، هەرکەسێک بیخواتەوە بە هیچ جۆرێک ناکەوێتە ناو تەنگ و چەڵەمەوە.

٢٠- شەفاعەتی رسول الله ﷺ بۆ خەڵک ڕاستییە و شەفاعەتی پێغەمبەران و فریشتەکان و زانایان و شەهیدەکان ڕاستییە.

٢١- ئەو ڕێگایە ڕاستییە، پردی سیرات ڕاستییە و لەنێوان قنطرە و دۆزەخە واتە: سەرپشکە لە نێوانیان، لەو شتە دروستانەی کەوا ئەویش ئەوەیە ڕێگایەکی دڕکاوی و ئازار بەخش و زەحمەت و ڕەزیل بوون نیە، وەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە:

﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ مريم: ٧١ - ٧٢

واتە: وە هیچ کەسێك لە ئێوە نییە ئیلا ئەبێ بەسەر پردی (سیراط) دا تێپەڕێ و بچێتە سەر ئاگری دۆزەخ، ئەمە کارێکە و بڕاوەتەوە

و کۆتایی هاتووە و الله بڕیاری لەسەر داوە. پاشان ئەوانەی تەقوای الله یان کردووە و لە الله ﷻ ترساون و، خۆیان لە تاوان پاراستووە ئەوانە ڕزگار دەکەین و لەسەر پردەکە دەیانپەڕێنینەوە، وە ئەوانەیشی کە ستەمکار بوونە و ستەمیان لە خۆیان کردووە بە کوفر کردن و، هاوبەشبڕیاردان لەسەر چۆکیان فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە. تەفسیری ڕێبەر

**٢٢-** تەرازوو ڕاستییە، زمانێک و دوو شانی هەیە کێشانەی کردەوەی مرۆڤەکان دەکات، وەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الأعراف: ٨ - ٩

واتە: {لە ڕۆژی قیامەت تەرازوو دادەنرێت بۆ کێشانی کردەوەکان} وە ئێمە بێ ئاگا نەبووینە و هیچ شتێك لە ئێمە شاراوە نییە لەوەی کە لە نێوانیاندا ڕوویداوە، وە تەرازووی حەق دادەنرێ لە ڕۆژی قیامەتدا کە دوو تای هەیە و زمانێکی هەیە قسە دەکات، وە زوڵم و ستەم لە هیچ کەسێك ناکرێ، وە هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوە چاکەکانی قورستر بێ ئەو کەسانە سەرفراز و سەرکەوتون.

وە هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوە چاکەکانی سووك بێ، ئا ئەوانە خۆیان دۆڕاندووە بە هۆی ئەوەی سەبارەت بە ئایەتەکانی ئێمە زوڵم و ستەمیان دەکرد و شوێنی نە دەکەوتن و بەگەورەیان نە دەزانی، لە ڕۆژی قیامەتدا کردەوەکان و پەڕاوەکان و مرۆڤەکانیش دەکێشرێن، بەڵام سوکی و قورسی مرۆڤەکانیش هەر بە هۆی ئیمان و کردەوەی چاکەوەیە کە قاچە باریکەکانی (عبدالله ی کوڕی مەسعود) لە تەرازوی قیامەت لای الله ﷻ لە شاخی ئوحود

قورستر و سەنگینترە، وە مرۆڤی قەڵەوی گەورە دێنن بۆ لای الله سوك و بێنرخە و کێشی باڵە مێشولەیەکی نییە، وە تەوحید و (لا اله الا الله) قورسترین کردارن لە تەرازوی قیامەت کە لە نەوەد و نۆ سجل تاوان قورستر بوون کە هەر سجلێك چەندێك چاو بڕ بکات ئەوەندە گەورە بوون. تەفسیری ڕێبەر.

**٢٣-** فوکردن بەزەویدا (نفخی صور) ڕاستییە، لە سەدەیەک ڕوودەدات کەوا ئیسرافیل لەو کات و ساتە فوی پێدا دەکات بە دوو فوو، فووی یەکەم هەرچی قورساییە و ناخۆشی و ناڕەحەتییە مرۆڤەکان دەیبینن تا هەموویان لەناو دەچن و فووی دووەم هەستانەوەی مرۆڤەکانە لەدوای مردنیان کە لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتوە:

﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الزمر: ٦٨

واتە: وە فوو ئەکرێ بە کەڕەنا و شەیپوردا لەلایەن ئیسرافیلەوە کە فوو کردنی یەکەمە و، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەر هەمووی دەمرێت و تیا دەچێت، تەنیا ئەوەی کە الله ویستی لێ بێت، کە وتراوە: ئیسرافیل خۆیەتی وە دواتر خۆیشی دەمرێت، یان فریشتەی گیانکێشانە، یان هەڵگرانی عەرشی پیرۆزی الله ﷻ، یان شەهیدەکانن، یان موسا پێغەمبەرە ﷺ، پاشان دووەمجار فووی پیا دەکاتەوە خەڵکی هەر هەمووی هەڵدەستن و لە گۆڕەکانیان دەردەچن وە تەماشا دەکەن، (نێوانی هەردوو فوو کردنەکە چل ساڵە). تەفسیری ڕێبەر

٢٤- قەومانێک دەردەچن لە ئاگری دۆزەخ و دەبردرینە بەهەشتەوە، الله تعالی بە ڕەحمی خۆی قەومانێک دەخاتە بەهەشتەوە و لە پێشەوە دەیانبات بۆ سەر ڕووبارێک لە لای دەرگای بەهەشتەوە، تەوبەیان پێ دەکات و نوێیان دەکاتەوە هەر وەک میوە لە دەنکەکەی دەڕوێی و دەبێتە دارو بەری دەگرێ هەتا هیچ شوێنەواری سوتان بەبەریانەوە نامێنێ، دواتر الله جل وعلا دەیانخاتە بەهەشتەوە و لەئـــاگر دوور دەبنەوە ئەگەر ئەو کەسەی تۆز قاڵێ باوەڕ لەدڵیاندا هەبێ.

٢٥- بەهەشت و دۆزەخ الله ﷻ دروستی کردون بۆ پاداشت و قەربوو و سزا وە کۆتاییان پێنایە و پێش دروستبونی مرۆڤ دروستی کردوە و دواتر مرۆڤی بۆیان دروستکردوە واتە بۆ بەهەشت و دۆزەخ، هەروەها الله ﷻ بە دەستی ڕاست هەموو شت دەگرێ، ئەڵێ: ئەوانە ڕۆشتنەتە بەهەشتەوە بە ڕەحمەتی من، وە هیچ باکم پێیان نییە و بە دەستەکەی تریش ئەڵێ: ئەوانە ڕۆشتنەتە دۆزەخەوە و باکیشم پێیان نییە، هەر کەسێک بڵێ: بەهەشت و دۆزەخ خودا دروستی کردوە و، کۆتایی پێدێت ئەوە کوفری کردوە بە ئایەتەکانی الله.[١]

---

(١)ـ چوار ئایەتەکە بیرتین لە:

- ﴿ ۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ﴾ آل عمران: ١٣٣
- ﴿ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢١ ﴾ الحديد: ٢١
- ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ١٣١ ﴾ آل عمران: ١٣١
- ﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتۡ مِرۡصَادٗا ٢١ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابٗا ٢٢ ﴾ النبأ: ٢١ – ٢٢. وەرگێڕ

٢٦- الله ﷻ بەدەستەکانی خۆی ئادەمی دروست کردوە، فوی بەڕوحیدا کردوە و فریشتەکان سوجدەی ڕێزیان بۆ بردووە.

٢٧- الله ﷻ ابراهیمی پێغەمبەری بە خەلیل و چاکەکار هەڵبژاردوە، قسەی لەگەڵ موسا کردوە و رسول الله ﷺ بەخۆشەویست و نزیکی خۆی هەژماری کردوە.(١)

٢٨- دەجال و، زیندەوەرەی سەرزەوی و، یأجوج و مأجوج و، دەرچونی خۆر لە خۆراواوە، هەمووی ڕاست و دروستە و دەبێ باوەڕمان پێی هەبێ.

٢٩- رسول الله ﷺ کۆچی کردوە بە لاشە و بە ڕووح بۆ ئاسمان لە شەوی إسرا و مەعراج، ڕۆشتووەتە بەهەشت و دۆزەخ و فریشتە و پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت هەمووی بینیوە، پێش ئەوانە چۆتە مزگەوتی حرام و لەوێشەوە چۆتە مزگەوتی ئەقصا و، دواتر بەرزکراوەتەوە لەوێ الله ﷻ بینیوە بە چاوەکانی و بەدڵی،(٢) بینینەکە وەکو بینینی نێوان دوو برۆ بوو و نزیکتر، الله ﷻ دەفەرمووێت:

---

(١) - الله ﷻ پێغەمبەرمانی بە خەلیل هەڵبژاردووە، هەروەك چۆن ابراهیمی بە خەلیل هڵبژاردووە، رسول الله ﷺ فەرموویەتی:{إنِّي أبْرَأُ إلى اللهِ أنْ يَكونَ لي مِنكُم خَلِيلٌ، فإنَّ اللهَ تَعَالَى قَد اتَّخَذَني خَلِيلًا، كما اتَّخَذَ إبْرَاهِيمَ خَلِيلًا}.
واتە: من هەڵبژێردراوم لە لایەن اللهوە بۆ ئێوە کە ببم بە خەلیل، والله ﷻ منی کرد بە خەلیل هەروەکوو ابراهیمی کرد بە خەلیل عليه السلام. رواه مسلم(٥٣٢). وەرگێڕ

(٢) - ئەهلی سونەت قسەیان کردووە دەربارەی بینینی الله ﷻ لەلایەن رسول الله ﷺ لە کتێبەکانی (الرد على المبتدعة) هی ابن البناء و کتێبی (جامع ورسائل) هی ئیمامی ابن تیمیة کە ڕونکراوەتەوە کە ڕاجیاوازی هەیە لەبینینی الله ﷻ بە چاوەکانی خۆی، ئەوەی واجبە شوێنکەوتەی ئەو ئەثەرانەبین کە لە سەلەفەوە پێمان گەشتووە کە ئایە بە چاوەکانی بینیویەتی یان بینینی بە ناخی دڵ (بە فؤاد)ی، بەڵام بینینی بە چاوەکانی لە شەوی معراج و هەر شەوێکیتر، ئەهلی سەلەف قسەیان کردووە کە نە هاتووە بینینی الله بە چاوەکانی بە هیچ سەنەدێکی جێگیر و هیچ هاوەڵێك و پێشەوایەك کە رسول الله ﷺ بە چاوەکانی سەری بینیبێتی. وەرگێڕ

﴿ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾ النجم: ١٧

واتە: وە چاوی پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی کە بینیوێتی لاینەداوە لێی و، بە جوانی بینیوێتی و سنووریشی نەبەزاندووە و چاوی فێڵی لێی نەکردووە. تەفسیری ڕێبەر

٣٠- لە سوننەتدا هاتوە ئەبێ دوای ئەمیر و سوڵتان بکەوین و نابێ دژیان بوەستینەوە ئەگەر خراپە کاریشیان کرد، ئەبێ گوێڕایەڵیان بکەین و پاڵپشتیان بکرێ، ئەگەر عەبدێکی حەبەشی بوو ئەگەر بێ گوێ و بێ لوت و بێ لێویش بوو.

٣١- لە سوننەتدا هاتوە ئەبێ حەجیان لەگەڵدا بکرێ، جیهادیان لەگەڵ بکرێ، نوێژی هەینی و جەژنەکان لە پشتی هەموو چاکە کارێک و خراپەکارێکەوە[1] دەکرێ.

٣٢- لە سوننەتدا هاتوە بێدەنگ بوون لەسەر ئەو ناخۆشیانەی لەنێوان هاوەڵانی ڕەسول الله ﷺ هاتوە و ڕویانداوە هەروەها بڵاوکردنەوەی باشەکانیان وهاندانی خەڵك بۆئەوەی ڕێبازەکەیان بگرێت لەبەر ئەوەی ئەوان ئەستێرەی گەشاوەی ئەم دینەن (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهم).

٣٣- ئەبێ ڕێز و دڵسۆزی لەنێوان شوێنکەوتوان وشوێنکەوتەی ئومەت و سەلەفی ساڵحین هەبێت ڕەحمەتی الله لە هەموویانبێت.

٣٤- لە سوننەتدا دەبێ وازهێنان لە ئەهلی ڕەئی و پیوەردانان بۆ دین.

(١) - خراپەکار واتە: کوفری نەبێ تەنیا لەسەر تەوحیدبێت، دروستە لە پشتییەوە نوێژ بکرێ. وەرگێڕ

٣٥- وازهێنان لە گفتوگۆی شەڕەنگێزی دەربارەی دین.

٣٦- وازهێنان لە قەدەرییەکان و ئەوکەسانە ئەهلی قسەن.[١]

٣٧- وازهێنان لەسەیرکردنی ئەوکتێبەکانی کە تەنیا قسەن وە کتێبی ئەستێرە ناسەکانیش.

٣٨- ئەو سوننەتەی کەوا ئومەتێك لەسەری کۆکراونەتەوە و وەرگیراون لە رسول الله ﷺ بە فرمانی الله تبارك الله تعال دەفەرمووێت: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُواْ ﴾ المائدة: ٩٢

واتە: وە ئێوە گوێڕایەڵی الله و ڕەسول الله بکەن ﷺ، وە ئاگادار بن لەسەرپێچی کردنی الله و ڕەسول اللهﷺ . تەفسیری ڕێبەر

وە دەفەرمووێت: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴾ النساء: ٨٠

واتە: هەر کەسێك گوێڕایەڵی ڕەسول الله بکاتﷺ بەدڵنیایی ئەوە گوێڕایەڵی الله ی کردووە و سەرفراز دەبێت. تەفسیری ڕێبەر

وە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ﴾ الحشر: ٧

واتە: وە ئەوەی کە ڕەسول الله ﷺ بۆی هێناون ئێوە وەری بگرن، وە ئەوەیشی کە ڕەسول الله ﷺ نەهی لێکردووە دەستی لێ هەڵبگرن، واتە: گوێڕایەڵی ڕەسول الله بکەن ﷺ، چونکە ئەو تەنیا فەرمانتان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگریتان لێدەکات لە خراپە. تەفسیری ڕێبەر

---

(١)- قەدەرییەکان ئەوکەسانەن کە قەدەر و زانستی الله ڕەت دەکەنەوە باوەڕیان بە ڕوکنێکی ئیمان کە قەزا و قەدەرە نییە، ئەهلی قسەن مەبەستی ئەو کەسانەیە ڕەئی خۆیان ئەڵێن. وەرگێڕ

وە الله ﷻ فرمانی بە رسول الله ﷺ کردوە ئەم پەیامە بگەیەنێت:

﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ﴾ المائدة: ٦٧

واتە: ئەی ڕەسول الله ﷺ ئەو پەیامەی کە لە الله وە بۆت دابەزیوە، تۆ بەسەرجەم خەڵکی بیگەنە. تەفسیری ڕێبەر.

٣٩- رسول الله ﷺ ئەم پەیامەی گەیاند و بانگەشەی بۆ کرد، بانگەشەی کرد خەڵك بگەڕێنەوە بۆ لای الله بە پێی قورئان و سوننەت فرمان بە خەڵک دەکات شوێنکەوتەی هاوەڵە بەڕێزەکان بن و، دوای هاوەڵەکان لە قسەی وەلی ئەمرەکان دەرنەچن وەکو الله ﷻ دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾ النساء: ٥٩

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هێناوە گوێڕایەڵی الله و گوێڕایەڵی ڕەسول الله ﷺ وە ئەوانەی کە فەرمانڕەوا و کاربەدەستی ئێوەن، چ فەرمانڕەوایان وە چ زانایان هەردووکی دەگرێتەوە لە چاکەدا، بەڵام لە خراپە و تاواندا گوێڕایەڵی بۆ کەس نییە. تەفسیری ڕێبەر

٤٠- باشترین ئەو زانایانەی دوای رسول الله ﷺ لە وەلی ئەمرایەتییە (ابو بکر، دواترعمر، دواترعوسمان، دواترعەلی) بوون (رَضِيَ اللهُ عَنْهم)، گەورە و گەورەکارەکانیان لە عەشەرەی موبەشەرە و ئەو هاوەڵانەی رسول الله ﷺ چاکەکانیان باسکردوون و رسول الله ﷺ فەرموویەتی:

((اقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي مِنْ أَصْحَابِي أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ))[١]

واتە: شوێن کەوتەی ئەوکەسانەبن لە دوای من دێن ابو بکر و عمر.

((أصحابي كالنُّجومِ بأيِّهم اقتديتُم اهتديتُم))[٢]

واتە: ((هاوەڵانم وەکو ئەستێرەن، شوێن هەرکەسێکیان بکەویت ئەوا ڕێگای هیدایەتی خۆت دۆزیوەتەوە)).

**٤١-** رسول الله ﷺ دەسی گرتوە بەو سوننەتانەی لە اللهوە پێی بەخشراوە و، ئەوەی هاوەڵان لە رسول الله ﷺ وەریان گرتووە و ئەوەی تابعین لە هاوەڵان وەریان گرتووە، ئەوهاوەڵانەی پەنجەی شەهادەیان بۆ درێژکراوە کە رسول الله ﷺ فرمانی کردوە شوێنیان بکەوین، وە هەروەها هاوەڵانیش ئیشارەتیان کردوە کە شوێنکەوتەی تابعین بین لە دوای خۆیان: (سعید بن مسیب و، علقمە بن وقاس، والأسود و، القاسم و، سالم و، عطاء و، مجاهد و، طاووس و، قتادە و، الشعبی و، عمر بن عبدالعزیز و، حسن البصری و، محمد بن سیرین).

لەدوای ئەوانەش: (ایوب سختیانی و، یونس بن عبید و، سلیمان تیمی و، ابن عوان، دواتریش سوفیان الثوری).

دوای ئەوانیش: (مالك بن ئەنەس و، زوەری و، ئەوزاعی و، شوعبە).

---

١- روى الترمذي (٣٨٠٥) عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ

(٢)ـ موضوع

دوای ئەوانیش: (یەحیا بن سعید و، حماد بن زید و، حماد بن سەلەمە و، عبدالله بن مبارك و، فُضیل بن عیاض و، سوفیان بن عویینە).

دوای ئاوانەش: (ابی عبدالله محمد بن ادریس الشافعی و، عبدالرحمن بن مهدی و، وكیح بن جراح و، ابن نومیر و، ابی نوعیم و، حسن بن ربیع).

دوای ئەم كەسانەش: (ابی عبدالله احمد بن حنبل و، اسحاق بن راهەوەی و، ابی زورعە الرازی و، ابو مسعود الرازی و، ابی حاتم الرازی).

ئەوانەی كە بینویانە: (ئەهلی شام و، حجاز و، مصر و، خۆراسان و، اصبهان و، مدینە بینیویانە وەكو: (محمد بن عاصم، اسید بن عاصم، عبدالله بن محمد بن نعمان، محمد بن نعمان، نعمان بن عبدالسلام ڕەحمەتی خوایان لێبێت).

ئەوانەی ئێمە پێیان گەشتوین و زانست و فەرموودە و سوننەتمان لێوەرگرتوون، وەكو: (ابی إسحاق ابراهیم بن محمد بن حمزە و، ابی قاسم الطبرانی و، ابی محمد عبدالله بن محمد بن جعفر ابی شیخ)، وە ئەوانەی لەوكاتە ئەهلی حەدیس بوون، دوای تەواوی ئەو كاتانە ابو عبدالله محمد بن إسحاق بن محمد بن یحیای ابن مندە الحافظ (ڕەحمەتی خوایان لێبێت).

ئەوانە هەموویان دەستگرتوبوون بە دین و بە ڕاستی شوێنكەوتەی سوننەت بوون و، هەروەها ئەوانە سەر پێش خەربوون لە علمەكەیان، هەموویان كۆبوونەوە لەسەر ئەو وشانەی كە لە سوننەتەوە بوون و، لەسەر سوننەتیش دەرۆشتن.

**٤٢-** شایەتی دراوە لەسەر بابەتی کۆکراوەی ئەم سونەتە و کتێبەکانی سەلەفی ئومەت کە ئەوانیش:

کتێبی(السنە) عبدالله کوڕی احمد کوڕی حنبل.

کتێبی(السنە) ابی مسعود، ابی زورعە، ابی حاتم.

کتێبی(السنە) لعبدالله کوڕی محمد کوڕی نعمان.

کتێبی(السنە) ابی عبدالله محمد کوڕی یوسف البناء الصوفی (ڕەحمەتی خوایان لێبێت).

هەروەها هەنێک کتێبی سوننەت هەیە بۆ ئەو کەسانەی کەوا سەلەف نین وەکو: (ابی احمد عسال و، ابی إسحاق ابراهیم کوڕی حمزەی الطبڕانی و، ابی شیخ و، زۆریتریش کە کتێی سوننەیان داناوە.

**٤٣-** ئەوانە هەمووی کۆبوونەوە و جێگیرکرا لەسەر ئەو بەشەی کەوا لە سوننەتدا هەیە لە کتێبەکانی سوننە.

**٤٤-** دوور کەوتنەوە لەو کەسانەی کەوا داهێنان و گومڕایی دەکەن لە دین.

**٤٥-** دژایەتی کردنی ئەو کەسانەی ئەهلی قسەی خۆیانن و، پێوەری خۆیانن و گفتوگۆ کردنی خۆیانن.

**٤٦-** ئەوەی لە سوننەتدا هاتوە ئەبێ شوێن کەوتەی قورئان و فەرموودە و سوننەت بین و ملکەچ بین بە فرمانەکانەوە.

**٤٧-** باوەڕهێنان بە سیفەتی الله ﷻ بەبێ لێکچواندن و، بەبێ هاوشێوە بۆدانان و بەبێ گۆڕین و بەبێ وەستاندن، هەموو ئەو

فەرموودانەی کەوا هاتون لەسەر سیفات وەکو رسول الله ﷺ دەفەرموێت:

((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ))[١]

واتە: ((ئادەمی دروستکردوە لەسەر شێوەی خۆی)).

((يد الله على رأس المؤذنين))[٢]

واتە: ((دەستی الله لەسەر ئەوانەیە کەوا بانگ دەدەن)).

((ان قلوب العباد بين اصبعين من أصابع الرحمان))[٣]

واتە: ((دڵی بەندەکان لە نێوان پەنجەکانی ڕەحمان دایە)).

((جعل اللهُ السَّماواتِ على أصبعٍ، والأرْضين على أصبعٍ))[٤]

واتە: الله ﷻ ئاسمان و زەوی بە دوو پەنجە گرتووە و، لەسەر پەنجەکانی خۆی دایناوە.

تەواوی ئەو فەرمودانەی کە هاتوون لە هەر ڕاستیەك لەبارەی ئەو سیفاتانەی الله وە کە لە رسول الله ﷺ وە گەشتووە، هەموو سەلەف کۆدەنگن لەسەر تەفسیرەکەی و خوێندنەوەکەی و وتویانە ئاوها وەریبگرن و جێگیری بکەن، هەروەکوو چۆن هاتووە بەبێ زیاد و بەبێ کەم، وەك ڕونکراوەتەوە لە ئایەتی اللەوە کە دەفەرمووێ:

---

(١) - روى البخاري (٦٢٢٧) ومسلم (٢٨٤١)

(٢)- الطبراني

(٣)- رواه ابن ماجة و امام احمد بن حنبل

(٤)- رواه بخارى ٤٨١١ ومسلم ٢٧٨٦

﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ ﴾ البقرة: ٢١٠

واتە: ئایا چاوەڕێی چ شتێك دەكەن كە موسڵمان نابن و نایەنە ناو ئیسلامەوە، تەنیا مەگەر چاوەڕێی ئەوە بكەن كە الله بێت بۆ بڕیاردان لە نێوان خەڵكیدا لە ڕۆژی قیامەت (هاتنێك كە شایستە و شایانی گەورەیی اللەیەو لە هاتنی هیچ لە دروستكراوەكانی ناچێت و چۆنێتیەكەیشی الله نەبێت كەس نایزانێت). تەفسیری ڕێبەر

وە دەفەرموویێت: ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ٢٢ ﴾ الفجر: ٢٢

واتە: وە پەروەردگاریشت دێت (هاتنێك كە شایەن و لایەق و گونجاوە بە گەورەیی الله كە لە هاتنی هیچ لە دروستكراوەكان ناچێ)، وە فریشتەكانیش پۆل پۆل دێن لەبەر دەستی الله ڕادەوەستن. تەفسیری ڕێبەر

بەڵام ئەمانە هەمووی ئەو سیفەتانەی كە هاتوون ئیمانیان پێ دێنین بەبێ چۆنیەتی دانان و گۆڕانكاری كردن پێی ڕازیبین و ئیمانمان پێی هەیە، ئیمانی پێ بێنین و ملكەچیشبین بۆی و بیریش نەكەینەوە لە چۆنیەتی سیفەتەكانی لله ﷻ بەرفراوانی و خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەهلی سوننەت پارێزراوییەكی بەرفراوان بە دەست دێنی، بە حەمد و سوپاسی (رب العالەمین)، وە داواكردنی سەلامەتی لە ناسینی سیفەتەكانی الله جل وعلا واجبە واتە: (بەبێ چۆنیەتی و لێكچواندن و هاو وێنەیی و وەستاندنی و تاویل كردنی) ناسینی سیفەت و كردەوەكانی الله واجبە، چونكە هیچ كەس لە الله ناچێت لە سیفەت و كردەوەكانیدا و، الله هەرگیز لە دروستكراوەكانی ناچێ:

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى: ١١

واته: هیچ شت و کەسێك له الله ناچێت، چونکه الله تاك و تەنیایه و دروستکاره، وه الله زۆر بیسەره بەوتەو قسەتان، وه زۆر بینەره به کردەوەتان، وه هەموو شتێك دەبیستێت و دەبینێت. تەفسیری ڕێبەر

وه نەفی دەکەین له هەموو تعطیلێک و گۆڕانکارێک.

٤٨- ئا ئەوەیه مەزهەبیبی ئەهلی سوننەت و جماعه و شوێن کەوتوان، هەرکەسێک دورکەوتەوە لەو مەزهەبه له سوننەت دورکەوتوەتەوە، هەرکەسێک لەگەڵیانبێت ئەوا دەستی گرتووه به سونەتەوە، ئێمەش حەمد و سوپاس وستایشی خوای پەروەردگار دەکەین لەو کەسانەمان هەژمار بکات و نەمانخاته لێشاوی ئەو مەزهەبانەی ترەوه و اللّٰه ئێمه و ئەوان کۆبکاتەوه له بەهەشتەکەی خۆی، وه ئەوەی سوننەته ڕێگای ئێمەیه و لەسەری دەڕۆین و ئەهلی شوێن کەوتوانیش ئوممەتی ئێمەن و الله ئێمەی لەسەر ژیاندوین و لەسەریشی دەمرین به ڕەحمەتی خۆی لەبەر ئەوەی الله خۆی قەریب وموجیبه...

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه اجمعين

وەرگێڕانی: أم سارة الكردية

## ناوەڕۆك

پێناسەیەکی خاوەن عەقیدەکە ............................................ ٥
ئەو کەسانەی باسیان کردووە ............................................ ٥
کۆکراوەی بیروباوەڕەکەی............................................ ٦
سەرچاوەی بیروباوەڕەکەی ............................................ ٦
لەوەسیەتەکانی دەست گرتن بە سونەت و بیروباوەڕی سەلەف...... ٧
ناوەڕۆك ............................................ ٢٦

